زنجیرەی جوانترین چیرۆك لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)

# پیاو چاكەكە

تصوير ابو عبدالرحمن الكردي

المكتب الاسلامي
AL-Maktab AL-Islami

نارين



الدار العربية للعلوم

مافی لە چاپدانی پارێزراوە بۆ
نارین


ناوی کتێب: زنجیرەی جوانترین چیرۆك لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ :(پیاو چاکەکە)

نووسینی: شادی فقیه

وەرگێڕانی: سەردار ڕەزا

پێداچوونەوەو هەڵەچنی: محەمەد مێرگەیی

نەخشەسازی ناوەوە: کۆمپیوتەری نارین (محمد علی)

چاپی یەکەم: ٢٠١٠

نۆرەو ساڵی چاپ: دووەم ٢٠١١

شوێنی چاپ: بەیروت – لوبنان

ژمارەی سپاردن: (٢٥٨٦)ی ساڵی (٢٠١٠)ی پێدراوە

نارین

بۆ چاپو بڵاوکردنەوە

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی



Website:www.nareenpub.com
E-mail: info@nareenpub.com

تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)

مۆبایل: ٠٠٩٦٤ ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠





الدار العربية للعلوم
Arab Scientific Publishers

المكتب الاسلامي

جوانترین چیرۆك

له فه‌رموده‌كانی پێغه‌مبه‌ری خوا (صلی الله علیه وسلم)

# پیاو چاكه‌كه



**نووسینی**

شادی فقیه

**وه‌رگێڕانی**

سه‌ردار ڕه‌زا


المكتب الاسلامي
AL-Maktab AL-Islami

نارین



الدار العربية للعلوم
Arab Scientific Publishers

کاتژمێرەکە بوو بە هەشتی شەو، ئێستا کاتە خۆشەکەی دانیشتنی شەوانە، ئیبراهیم بەخێرایی ڕۆیشت بۆ ژووری کتێبخانەکە، تەماشای کرد فاتیمەی خوشکی لەپێش ئەوەوە گەیشتۆتە ئەوێ.

ئیبراهیم: سلاوت لێبێت خوشکەکەم.

فاتیمە: سلاو لە تۆش بێت برا گیان، ئەمڕۆت چۆن بەسەر برد؟

ئیبراهیم: لەگەڵ هاوڕێیانمان بە پاسکیلەکانمان هەندێ گەڕاین.

فاتیمە: خۆشتان بەسەر بردووە.

ئیبراهیم: زۆر خۆشمان بەسەربرد ... بەڕاست باش بوو بیرم کەوتەوە، چاکەیەکم لەگەڵ کردوویت.

فاتیمە: چاکەی چی؟

ئیبراهیم: لە یوسفی هاوڕێم زانیم کەوا ڕوقیەی خوشکی ئەو کتێبێکی وێنەداری لە تۆ خواستووە، منیش پێم گوت: بە خوشکەکەی بڵێ، کە خۆمان پێویستمان پێیەتی، بەڵکو بۆمان بنێرێتەوە.

فاتیمە: باشە ئیبراهیم چۆن تۆ لەخۆتەوە کاری وا دەکەیت؟ من داوای ئەمەم لە تۆ نەکردووە!

ئیبراهیم: ئاخر بە خوا من گومانم وابرد تۆ پێویستت پێیەتی. ئیتر پێویست ناکات لە لای ڕوقیە بمێنێتەوە.

فاتیمە: کێ دەڵێ ڕوقیە پێویستی پێی نییە و سوودی لێ نابینێ.

لەم کاتەدا هەردووکیان گوێیان لە دەنگی پێی باوکیان بوو، لە دەرگاکە نزیک دەبوویەوە، بۆیە بێدەنگ بوون.

باوك: سڵاوتان لێبێت ڕۆڵەكانم.

مناڵەكان: سڵاو لە تۆش بابەگیان .

باوك: ئەوە چیتانە؟ من گوێم لێتان بوو بە توندی قسەتان لەگەڵ یەكتریدا دەكرد، پێم بڵێن باسی چیتان دەكرد؟

ئیبراهیم: بابەگیان بە خوا وابزانم من ئەمڕۆ هەڵەیەكی گەورەم كردووە. خوشك و براكە باسەكەیان بۆ باوكیان گێڕایەوە، باوك بزەیەكی گرت و گوتی:

باوك: یەکەم، ئیبراهیم کوڕی شیرینم پێش هەموو شتێك پێم خۆشە دەستخۆشی ئەو ئاکارە جوانەت لێ بکەم. ئەویش ئەوەیە کە دانت بە هەڵەکەی خۆت دنا. ئەوەش چاکترینی کارێکە، کەسێك پێی هەڵبستێ، کاتێك دەکەوێنە هەڵەیەکی لەو جۆرەوە، نابێت پێداگیری لەسەر بکەین، بەڵکو داوای لێبوردن بکەین و هەوڵدەین خۆمان چاك بکەین، جارێکی تر هەڵەی لەو جۆرە دووبارە نەکەینەوە.

مناڵەکان: باشە بابەگیان ئێمەش بەڵێنت پێدەدەین، دان بە هەڵەکانماندا بنێین و هەوڵی ڕاست کردنەوەیان بدەین و سنگمان فراوان بێت، هەڵەکانیش دووبارە نەکەینەوە.

باوك: دووهەم، چیرۆکێکی زۆر جوانم لایە بۆ هەردووکتانی دەگێڕمەوە، کە بۆ ئەم گفتوگۆیەتان سوودی لێدەبینن.

مناڵەکان: کەوایە بابەگیان بۆمانی بگێڕەرەوە.

**باوک:** لە سەردەمی دێریندا، پیاو چاکێك هەبوو، خوای پەروەردگار ناز و نیعمەتی زۆری پێ بەخشی بوو، پیاو چاکەکەش سوپاسی خوای دەکرد لەسەر ئەو نیعمەتانە و ئەویش یارمەتی خەڵکی دەدا و لێی دەبەخشییەوە.

ڕۆژێك لە ڕۆژان یەکێك لە پیاوە بازرگانەکانی خەڵکی لادێکەیان هات بۆ لای.

**بازرگانەکە:** سڵاوتان لێبێت ئەی بەندەی خوا، هاتووم بۆ لات پێویستییەکم هەیە، تاوەکو بۆمی جێبەجێ بکەیت و نائومێدم نەکەیت.

**پیاو چاکەکە:** سڵاو لە تۆش بێت، یاخوا بەخێر بێیت هەرچیت دەوێ داوای بکە فەرموو:

**بازرگانەکە:** هەموو پارە و سامانەکەم لە بازرگانیدا ونکردووە، تۆش دەزانی من خاوەنی خێزاندارێکی زۆرم و منداڵی زۆرم هەیە. ئایا هەندێ پارەم بە قەرز دەدەیتێ، تاکو بازرگانی پێوەبکەم و خەرجی ماڵ و منداڵەکەمی پێ جێبەجێ بکەم. خوا بیکات دوایش پارەکانت بۆ دەگێڕمەوە.

**پیاو چاکەکە:** ئەی بە سەر چاوەکانم من هەموو کاتێ لە خزمەتت دام و چەندت بوێ دەت دەمێ.

بازرگانەکە: براکەم! خوای گەورە پاداشتی چاکەت بداتەوە، بەشێوەیەك کە خۆشت نەزانی لەکوێوە بۆت هاتووە.

باوك: جا پیاو چاکەکە فەرمانی کرد بە خزمەتکارێك، کە لەلای بوو، پێی گوت: ئادەی برۆ ئا ئەو پارەیەم بۆ بێنە ئەها لەوێدا دام ناوە.

خزمەتکارەکە پارەکەی هێنا و پیاو چاکەکە پارەکەی دا بە بازرگانەکە، پاشان سوپاسی خوای پەروەردگاری کرد.

پیاو چاکەکە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی منی کردووە بەهۆی جێبەجێ کردنی پێویستی براکەم. داوا لە خوا دەکەم هەمیشە سەرکەوتووم بکات بۆ ئەوەی پێویستییەکانی خەڵکی جێبەجێ بکەم.

باوك: ئیتر بازرگانەكە ڕۆیشت، پاش كەمێك پیاوێكی تر هات بۆ لای پیاو چاكەكە.

پیاوەكە گوتی: ئەی پیاو چاك من باری گوزەرانم ناخۆش بووە، زۆر دڵم تەنگە، جا ئێستا وا هاتووم بۆ لای تۆ، بەڵكو هەندێ پارەم بە قەرز بدەیتێ، تا باری گوزەرانمی پێ چاك بكەم.

پیاو چاكەكە: فەرموو براكەم، ئەو پارە بۆ تۆ، كەی توانات هەبوو بۆم بگەڕێنەوە.

باوك: پاشان ژنە دراوسێیەکیان هات بۆ لای و ئەویش کارێکی هەبوو.

ژنە دراوسێکە: ئەی دراوسێی چاکەکارم، ئایا هەندێ پارەم بە قەرز دەدەیتێ، تا منداڵە بچکۆلە هەتیوەکانمی پێ بەخێو بکەم، دوایی ئەگەر خوا کردی بۆت دەگەڕێنمەوە.

پیاو چاکەکە: فەرموو خوشکەکەم ئەم پارە بگرە، ئەو پارەیەی پێشووش کە پێم دایت لێت ناسێنمەوە و مەیهێنرەوە، ئەم پارەیەش هەر کاتێ خوای پەروەردگار کاری بۆ ئاسان کردی بۆمی بهێنەرەوە.

**باوك:** ئەو منداڵەی لە لای پیاو چاکەکە کاری دەکرد هەموو ئەو ڕووداوانەی بە چاوی خۆی بینی، بۆیە دەستی کردە بیرکردنەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی: گەورەم پیاوێکی چاك و باشە، ئەو شەرم دەکات داوای ماف و پارەکانی خۆی لە خەڵکی بکاتەوە.

دەبێ لەمەودوا ئەو پارانەی خەڵکی لێیان قەرز کردووە بۆی کۆبکەمەوە.

**باوك:** خزمەتکارەکە بەخێرایی دەڕۆیشت و لە دەرگای ماڵی قەرزارەکانی دەدا، داوای پارەی پیاو چاکەکەی لێدەکردنەوە.

خزمەتکارەکە: دەبێت ئەو قەرزەی لە لاتە بیگەڕێنیتەوە بۆ گەورەکەم، کوا پارەکە؟

بازرگانەکە: بەڵام ئێستا ناتوانم هەر کاتێ کاروانەکە گەڕایەوە پارەکەی بۆ دەهێنمەوە، داوای لێ بکە تا کەمێ مۆڵەتم بدات.

باوك: پاشان خزمەتکارەکە ڕۆیشت بۆ شوێنێکی تر و گوتی:

خزمەتکارەکە: تۆ پارەت لە گەورەکەم بە قەرز وەرگرتووە و وا ئێستا کاتی ئەوە هاتووە قەرزەکە بدەیتەوە.

پیاوەکە: فەرموو کوڕم ئەوە بەشێکی کەمی قەرزەکەیە و پاش ماوەیەك ئەوەی تریشی بۆ دەگەڕێنمەوە، لەبەرئەوەی ئێستا لەم کاتەدا لە نارەحەتی دام.

خزمەتکارەکە: ئەوە چییە؟ ئێوە قەرزەکە نادەنەوە، دەبێ بە گەورەکەم بڵێم لەمڕۆ بەولاوە قەرزتان پێ نەدات.

باوك: پاشان خزمەتكارەكە هەرچی كردبووی بۆ گەورەكەی گێڕایەوە.

خزمەتكارەكە: گەورەم من ڕۆیشتم بۆ لای قەرزارەكان و داوای قەرزەكانم كردەوە، بەڵام كەمێكیان قەرزەكەیان دایەوە.

پیاو چاكەكە: خوایە گیان داوای لێخۆشبوونت لێدەكەم و لێم خۆشبە، خوایە گیان خۆت دەزانی، من فەرمانی وام بەم خزمەتكارە نەكردووە كاری وابكات ... كوڕم ئەوە كێ فەرمانی پێ كردووی بەو توندوتیژییە مامەڵە لەگەڵ خەڵكیدا بكەیت؟

یەكەم: تۆ دەزانی ئەگەر بەزەییت پێیاندا بێتەوە ڕەحمیان پێ بكەیت و لێیان خۆش بوویت، ئەوا كە گەیشتیتەوە بە خوای پەروەردگار، خواش ڕەحمت پێ دەكات و لە گوناهەكانت خۆش دەبێت؟ جا ئاگاداربە جارێكی تر كاری وا دووبارە نەكەیتەوە، بەڵكو ئارامیان لەگەڵدا بگرە و چاكبە لەگەڵیان.

خزمەتكارەكە: گەورەم لێم ببوورە، لەمەودوا لێیان خۆشدەبم بۆ ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا خواش لە من خۆشببێ.

باوك: خوای پەروەردگار دوعای پیاو چاکەکەی وەرگرت و لێی خۆشبوو و خستیە بەهەشتەوە.

ئیبراهیم و فاتیمە: ئای چیرۆکێکی خۆشبوو، بابەگیان ئێمەش دەمانەوێ بەزەییمان بە هاوڕێکانمان و خەڵکیش دابێتەوە.

باوك: جا ئێستا پێویستە ئیبراهیم ئەو کتێبەی لە لاتە بیدەتەوە بە ڕوقیە.

ئیبراهیم: بەسەرچاو بابەگیان، هەتا تەواوی نەکات و لێ نەبێتەوە لێی داواناکەمەوە.

باوك: ئافەرین کوڕەکەم، خوای گەورە پاداشتی خێرت بداتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت:

(( كانَ رجلٌ يداين الناسَ فكان يقول لفتاهُ: إذا أتيت معسراً فتجاوز عنه لعل الله أن يجاوز عنا: فلقى الله فتجاوز عنه)).

بوخاری گێڕاویەتییەوە (٢٠٨٧)

موسلیمیش گێڕاویەتییەوە (١٥١٢)

(واتە: پیاوێك هەبوو قەرزی دەدایە خەڵكی بە خزمەتكارەكەی گوت: ئەگەر قەرزدارێك هاتە لات و نەدار و بێ پارە بوو، ئەوا قەرزەكەی لێ مەسێنەرەوە و لێی خۆشبە، بەڵكو خوای پەروەردگاریش لە ئێمە خۆشبێت: كە پیاوەكە گەڕایەوە لای خوای پەروەردگار خواش لەو خۆشبوو).

زنجیرەی جوانترین چیرۆك لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

## خۆشەویستی لەبەر خوا



AL-Maktab AL-Islami

زنجیرەی جوانترین چیرۆك لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

## كەچەڵ و بەڵەك و نابینایەكە



AL-Maktab AL-Islami

Arab Scientific Publishers

زنجیرەی جوانترین چیرۆك لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

## پیاو چاكەكە



AL-Maktab AL-Islami

زنجیرەی جوانترین چیرۆك لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

## هاوەڵانی كەشتییەكە



AL-Maktab AL-Islami

ISBN 9953-29-652-9

